# پێشەکی

**شوکر** و سوپاس بۆ دروستکاری جیهانیان,سەلاوات لەسەر

رابەری ئەنوەر( صلى الله عليه وسلم ) وەدەپارێینەوە لە الله جل جلالە و دەلێین: (اللهم إني أسألك علما نافعا و رزقا طيبا و عملا متقبلا )واتا:ئەی خودایە من داوای زانستێکی بەسود و رۆزیەکی پاك( حەلال ) و کردەوەیەکی وەرگیراوت لێدەکەم. ئەم بەرهەمەم بریتیە: لە گەڕان و پشکنینی بەندە بۆ خۆم لە چۆنیەتی نوسین و کاراماییەکانی بەلاَم دواتر بریارم دا بلاَوی بکەمەوە بۆ ئەوەی ئێوەی بەرێزیش سودی لێوەرگرن.

## گولبژێرێك لە گەورەیی نوسین

﴿اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ (3) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (4) عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (5)﴾ **باشترین بەڵگە بەلگەی قورئانە کە باس لە گرنگی بەهای خوێندن و نوسین بکات , ئینجا ئەم ئایەتانە لە سەرەتای هاتنی سرشەوە بوو, کەواتە ئەوانەی دەخوێن وو دەنوسن بەشتێك لە ئاین جێبەجێ دەكات ,**

**پاشان الله جل جلالە باسی پلەو شكۆی ئەوانە دەكات كە فریشتەكەكانن** ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ (10) كِرَاماً كَاتِبِينَ (11)﴾.

**وەپاشان پلەكەی گەورەتر دەبێ ئەوكاتەی كە الله جل جلالە سوێند بە پێنوس دەخوات كە ئامرازێكە بۆ نوسین** ﴿ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ (1) مَا أَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ (2)﴾ **وە زیاتر لە سەدەها جار وشەی زانست بە هەمو جۆرەكانیەوە هاتوە كە پێویستیەكی حەتمیە .**

پەیامبەری سەرووەرمان دەفەرموێ : ( قیدوا العلمَ بالکتاب ) داواکراوە کە وا زانست و زانیاری ببیەستینەوە بە نوسین و بۆئەوەی بە هەدەر نەچێت .

شاعیر ( ذو الرمة ) بە عیسای کوری عمر دەلێت : ( شیعرەکانم بنوسەوە نوسنەوە لە لام سەرسورهێنەرترە لە لەبەرکردن( ئەزبەرکردن ) دەشتەکیەك وشەیەك لە بیردەکات کە شەو نخونیم بۆی کردوە وە لە شوێنی وشەیەکی تر دادەنێت و کە وەزنەکەی یەکسان نیە , نوسینەوە لە بیرناکرێ و ناگۆڕدرێ وشەیەك بە وشەیەکی تر )

پێشین زۆر پێداگریان لەسەر نوسین کرد و بەگەورەیان زانیوە هەروەکو سەعید کوری عاص دەلێت: ( ئەوەی نەنوسێت راستەی چەپە ) وە مەعنی کوری زائیدە دەڵێت : ( ئەگەر دەستێك نە نوسێت ئەوا پێیە ) وە المؤید دەلێ : ( نوسین بەرێزترین پیشەی دونیایە لە دوای جێنیشینی )

زانایان باسیان کردوە کە : یوسف ( علیه السلام ) نوسەری عەزیزی میسر بوو ، وە هارون ( علیه السلام ) و یوشع ی کوری نون ( علیه السلام ) هەردوکیان نوسەری موسی بوون ( علیه السلام ), وە سولیمان ( علیه السلام ) نوسەری باوکی بوو ( علیه السلام ) وە ئاسف کوری بەرخیا و یوسف کوری عەنقا

نوسەری سولیمان بوون ( علیه السلام ) وە یحیای کوری زەکەریا نوسەری عیسا بوو ( علیه السلام ).

ئەوانەی بون بە جێنیشین ( خلیفه )

ئەبو بکری صدیق نوسەری پێغەمبەرمان بوو دواتر بو بە جێنیشین , وە ئیمام عمر و عوسمان و عەلیش ( خودا لێیان رازییێ ) هەروا. وە موعاویە وش. وە مروانی کوری حەکەم و نوسەری عوسمان بوو دواتر بو بە جێنیشین وە عبدالملك نوسەری معاویە بوو

دەگێرنەوە دەلێن وەزیری موهەللەبی لەسەرەتای ژیانیدا زۆر نەدارو کەم دەرامەت بوە , لە سەفەرێکدا حەزی بە خواردنی گۆشت هەبوو کەچی نەیدەتوانی بیکرێ بۆیە وتی :

ألا موتٌ يُباعُ فأشتريه ** فهذا العيشُ ما لا خَيرَ فيهِ

ألا موتٌ لذيذُ الطعمِ يأتي ** يُخَلِّصَني من العيشِ الكَريهِ

إذا أبصرتُ قبراً مِن بعيدٍ ** وددتُ لو أنني مما يليهِ

ألا رَحِمَ المهيمنُ نَفْسَ حُرٍ ** تصدِّقَ بالوفاةِ على أخيهِ

برادەرەکەی کە ناوی عبداللە صوفی بوو چو گۆشتی بۆ کڕی و لێیانا و خواردییان , دواتر لێك دابڕان , بە هۆی نوسینەوە موهەللەبی بوە وەزیر نزیك بۆوە لە سولتان .[1]

**نوسین** :واتا دروستکردن و داهێنان ,ئەوەش پەیوەستە

بە مەوهیبە و خۆئامادەکردن .

وشە هێزە گەورەکەی جیهانە لە هەمو سەردەرم و شوێنێکدا،
بۆیە دەنوسین تا دەورەو بەرمان و جیهان بگۆڕین،

نوسین راهێنانی بیرە و ئاوەزە , زۆربەی کات ئەو شتەی لەناو مێشك و خود داهەیە ئالۆزە بۆیە نوسین ئەو شتە ئالۆزە شی دەکاتەوە وای لێدەکری کە سودی لێوەربگیرێ,ئەوەش بەرجەستە نابێت تەنها بە راهێنان و خوێندنەوەی بەردەوام نەبێت ,مەبەستیش لەمە ئەوەیە کە ئێمە بتوانین

[1] - بروانە پەرتوکی (صبح الاعشی- ابو عباس قلقشندي) بەشی یەکەم.

بەشێوەیەکی نایاب دەربڕینەکانمان دەرببڕین و هەڵەی زمانەوانی نەکەین

ئەو بیرەی هەمانە بەشێوەیەکی رون و ئاسان بخوێندرێتەوەو لێی تێبگەن .

لە پەرتوکی ( مناهج النقد الادبی ) دا هاتوە ( ئەوەی دەیەوەێ نوسینی باشتر بکات پێویستە لەسەری : باشترین نوسەر بخوێنێتەوە وە گوێ لە باشترین وتاربێژ بگرێ وە پێویستە شێوازێك بۆخۆی دابهێنێت بە هەول و تێکۆشان .

پرسیارم لە دکتۆر عمر علی کرد کە لە دەرەوە دادەنیشێت" دەربارەی گەورەیی نوسین بەم شێوە نایابە و ناوازەیە وەلآمی داینەوە ئەمەش دەقەکەیەتی :

نووسین

یەکەم وشەی پەیامی ئاسمانی کە بوو بە دەستپێکی پەرتوکی کۆتایی بە بخوێنە بوو (اقْرَأْ)، بەڵام نابێ لەبیری بکەین کە گرنگی خوێندنەکە لەوەدایە کە بەناوی خوای گەورەوە بێ (بِاسْمِ رَبِّكَ) خوێندن پێدراوێکی خواییە و زانستەکانی لە ڕێگەیەوە لەخۆی گرتووە، لە ڕێگەی خوێندنەوە مرۆڤەکان بۆ پلەی هەرە بەرزیی بەرز دەبنەوە، زانست و چۆنیەتی بۆشاییەکانیان بۆ دەردەکەوێ، بۆیە دەبینین لە چەندین دەقی قورئان و فەرمووودەی دروستدا

هاندراوین بە چەندین شێوازی جۆراو جۆر بۆ خوێندن، ئەوەندە گرنگی هەیە ئەوانەی کە تێیدا قوڵ بوونەتەوە زیاتر لە پەیامی پشت ئەو خوێندنە تێدەگەن، کە ئەویش پڕکردنەوەی بۆشاییە مرۆییەکانە.

خوێندن کە گرنگیەکی زۆری هەبێ، نووسین پلەیەکی باڵاترە، چونکی خوێندن وەرگرتنەو نووسین بەخشینە، خوێندن کە بەناوی خوای گەورەوە بێ، نووسین دەبێ ٢ جار بەو ناوەوە بێ، جارێك بۆ خۆت و جارێك بۆ بەرانبەر، نووسین بەرهەمی خوێندنە، بەڵکو خوێندێکی زیاتر لە ئاسایی، ئەوانەی ئاسایی دەخوێنن تەنها بۆ خۆیان فێردەبن، ئەوانەی ئامانجدارانە دەخوێنن زیاتر فێردەبن، ئەو زیادەیەش نووسینە، ئەو زیادەیەش بەخشین و پێدانی جۆربەجۆرە، وەك مامۆستایی، فێرکردن و گواستنەوەی ئەو ئەزموونە.

نووسین مانای جگە لە زانین توانایەکی تایبەتیشە، زۆرن ئەوانەی دەخوێنن، کەمن ئەوانەی دەنووسن، بە مانایەکی تر زۆرن ئەوانەی فێردەبن، بەڵام کەمن ئەوانەی کە فێرکارن.

نووسین دونیایەکی زۆر قوڵ و فراوان و تایبەتە، پڕ پڕیەتی لە بەرپرسیاریەتیش، چونکی خوێندن بۆ خۆت بێ، نووسین بۆ خەڵکە، نووسین بەرهەمی چۆنیەتی خوێندنە، بەرهەمی بەرەکەتی

ئەو ناوەیە کە چەند بە دڵ دانی پێدانراوە، زۆرن ئەوانەی کە دەنووسن لەم سەردەمەدا، کەمن ئەوانەی بە دروستی خوێندبێتیان، خوێندن و نووسین لەم سەردەمەدا ڕێك وەك هەنگ و هەنگوین وایە، هەنگوین زۆرە لە بازاڕدا، کەمن ئەوانەی بەرهەمی گوڵێکی پاکی بێ غەش بێ، مرۆڤی مسوڵمان دەبێ وەك هەنگ هەڵمژێ و بگەڕێ و ماندوبێ، وە بەرهەمەکەشی ئەسڵی بێ.

ڕواڵەت هەمووی هەر نووسینە، بەڵام ناوەرۆك جیاوازی زۆرە، نووسینی ئەسڵی تام و بۆن و ڕەنگیشی هەیە، کەواتە ڕێك وەك هەنگ بە، زۆر بگەڕێ و ماندوو مەبە، بەسەر گوڵەوە بنیشەرەوە، بە ئیلهامی خوایی هەنگاوەکانت هەڵگرە، بە دڵسۆزی هەڵیمژە و بە دڵ بیدەرەوە.

خوێندن ڕزقە، نووسین زەکات و سەدەقەو و بەخشینە.

قورئان بۆ پاداشتی خوێندنی نەك وشە، بەڵکو پیتیشی وەك ژمارە حسێب کردووە، تۆش لە نووسین دا حسێب بۆ پیتەکانیشت بکە، چونکی هەمووی یان تاوان وەیان پاداشتی لەسەرە.

بەناوی خوای گەورەوە بخوێنە، وە بەناوی خوای گەورەو بۆ خوای گەورەش بیدەرەوە.

هەمان پرسیارم لە مامۆستا رێیاز شێخە کرد وەڵامێکی جوان و قەشەنگی دامەوە و وتی :

لەگەورەیی نوسین ئەوەیە خودا گەورە نوسەرە و خودای گەورە یەکەم کەس بوە کە نوسینی کردوە , یەکەم شت کە دروستی کروە قەلەم بوە ,وتی: (أكتب) واتا بنوسە قەلەم وتی: چ بنوسم راستە خودا بەدەستی پیرۆزی خۆی نەینوسیوە , گرنگ ئەوەیە کە نوسەرە.

وە ئیمامی شافعی قسەیەکی جوانی هەیە کە دەڵێ :

العـلـم صيــد والكتابة قيــده ،،، قيّد صيودك بالحبال الواثقة

فمن الحماقة أن تصيد غزالة ،،، وتتركها بين الخلائق طالقه

هەمان پرسیارم لە مامۆستا حمزە شوانی کرد وەڵامێکی جوان و قەشەنگی دامەوە و وتي :

سەرەتاکانی نوسین دەگەڕێتەوە بۆ ئەوتوانایانەی بەندە کەکەلەناوەوەیدا هێزیک و حەزێک هەڵدەقوڵێ ، تاکو دێرەکان بە جۆرێکی سەلیقە ئامێز و جوان دەربڕبڕێت،

لەهەموسەردەمێکدا نوسینەوە بایەخی تایبەتی هەبوە، گەرچی سەردەمانی کۆن ئامرازەکانی مانەوەی بەردەستنەبوون، چی لەوەگرنگترە ئافرێنەری بونەوەر هەرجۆرە ویستێکی خۆی بۆ مورڤایەەی لەڕێی نوسینەوە ناردوە تا بمێنێتەوە، هەرلەڕێی نوکی خامەوە دابو نەریتی جوان و بەهابالْکانیان زانست و پێشکەتنەکانیان دەگۆێزرێنەوە .دەبینی خەڵکانیک لەکاتێکدا لێوانەلەخەمو پەژارەدا لەئەوجی نائومێدیدایە بەڵام کاتێک قەڵەمەکەی دەگرێتەدەست پڕبایەخترین وڕەونەشدارتر هەست و بۆچنی ناخی دەردەبڕێت کە زمان گۆنوکات پێی، بۆیە دەڵێین نوسین پێش خوێندنەوە ئاوەزفراون و گەشەتر دەکات، دەتوایَ وشەکان بەجۆڕێک بهۆنێتەوە کەخوێنەر ناتوانیَ دەریان بڕیَ.

## کارامییەکانی نوسین

1- توانینی نوسەرە بەوەی کە بتوانێت ئاما نجەکەی وە شێوازەی بەرجەستەکردنی بنوسن.

2- دەست نیشانکردنی هزرەکەکانی وە بە وردەکاری هەمو لایەنەکان .

3- هزرو بیرەکانی رون و رەوان بن .

4- رەگەزەکانی رازیکردنی تیدابیّ پالپشتی کردن راوبۆچون .

5- رستەکان با کورت و پوخت بن , لەگەل گشتگیریشی لەگەل بێت .

6- پشت بەستن بە هەندێ سەرچاوەی کۆن و نوێ.

7- ئەگەر وەسفکردن یان گێڕانەوە یان روداو بوو دەبێ بە گتشگیری بێت.

## مەرجەکانی نوسین

1- پێویستە نوسەر خاوەن رۆشەنبیریەکی فراوان بێ و خوێنەرێکی بەردەوام بێ.

2- پێویستە ئەو بابەتەی کە لە بارەیەوە دەنوسێ باش باش لێی تێبگات .

3- باوەڕی تەواوی بە بابەتەکە هەبێ کە دەینوسێ.

4- هەمو نوسینێك پێویستی بە پێشەکی هەیە , بۆیە هەولدەدەم پێشەکیەکی جوان و بەهێزی بۆ دادەنێم,

5- لە بابەت نەچونەدەرەوە

هەوڵدەدەم لە بابەتی دیاری کراو نەچمە دەرەوە وە ئەوەی دیاری کراوە باس دەکەم و شی دەکەمەوە و هەلیدەسەنگێنم و بەراوردی دەکەم و زیاد و کەمی دەکەم و رەنخنەی لێدەگرم بەلاّم لە بابەت ناچمەدەرەوە .

6- ڕێکخستنی دەقەکە

دوای ئەوەی نوسینی بابەتەکەم تەواو کرد دەبیٚ بابەتەکان ڕێکبخەم ,و بە شێوازیك کە لایەق بێت ڕێزبەندیان دەکەم .

7- ئەو بیرو رایەو زانست و گریمانانەی هەمە دەبیٚ بەشێوازێکی نایاب دەریانببڕم بەڕاستی بیانوسم ئاگاداری ڕێزمان و ڕەوانبێژی و واقیع بم .

8- کاریگەر و سەرەنج ڕاکێش بی

دەبیٚ نوسەر هەولبدات نوسنەکانی کاریگەر و سرنج راکێش بێت بۆ رازیکردنی خوێنەر.

9- دەبیٚ رستەو پارچە نوسینەکان پەیوەندیان بەیەکەوە هەبێت.

10- کۆتایی

کۆتایی بە بابەتە دەهێنم بەچەند وشەیەکی کورت و پوخت.

**ئەوەی دەیەویٚ ببیٚ بە نوسەر دەبیٚ ئەم مەرجانەی تێدا بیٚ :**

1- رۆشنەبیری زمانەوانی و فەرهەنگی.

دەبێ نوسەر زانا بێت بەو زمانەی کە پێی دەنوسێ وە ئاگاداری فەرهەنگەکەی بێ و وشەی رێك و پێك بەکار بهێنێت.

2- رۆشنەبیری رێزمانی.

خۆگرتن لەهەلەی زمانەوانی پێویستە .

3- رۆشەنبیری ئەدەبی : ئەمە پێویستە بۆ جوانکردن و سرنج راکێشانی خوێنەر و بەرچاورونی لە بابەتەکە.

4- رۆشەنبیری رەخنەیی : ئەمەش هەندی زانیاریە دەربارەی رەخنە و بنەمان و لێ تێگەیشتن و وردبونەوەی پێویستە.

5- رۆشەنبیری زانست و زانیاری.

پێویستە نوسەر ئەوەندە زانیاری پێ بێ کە بتوانێ بابەتەکە شی بکاتەوە , وە زانست و زانیاری دەرەکیش بزانی بۆ دەولەمەند کردنی بابەتەکە .

پێویستە بابەتی دەربرین رونتر بکەینەوە

لە دەربرینی ڕۆژانەماندا جۆرەها وەشە بەکار دێنین ئەو بیرەی لە خەیاڵماندا هەیە دەریاندەبرین بە هۆی وشەوە, ئەگەر کەسێك ڕۆشەنبیریەکەی مام ناوەند بێت ڕۆژانە ( 2500 ) وشە بەکار دێنێت بەڵام کەسانی ڕۆشەنبیر بەرز لە ژیانی ڕۆژانەی ( 4-5 ) هەزار وشە بەکار دێنێت

کەواتە هەرچەند وشە و دەربرینی جیاواز بەکاربێنین پلەی ڕۆشەنبیریمان بەرزتر دەبێتەوە , وە ئەو بیرو خەیالانەی لە ناخماندا هەیە دەتوانین باشتر دەریانبڕین . ئەوەش توانای زیرەکی و بلیمەتیمان زیاتر دەکات ,

زمانزانە نوێیەکان کە زمان جۆری هەیە لەوانە هەیە کە لەماناکەی تێدەگەی , وە هەیە کە راست و دروستە وە هەیە پریەتی لە ڕەوانبێژی.

جۆری یەکەمیان تەنها بۆ لێك تێگەیشتنە و هیچی تر , ئەوەی دوەمیان ئەو جۆرەیان پەیوەستە بە کۆمەلێك ڕێسا و یاسای زمانەوانی و کۆمەلایەتی هەمو کایەکانی ژیان , ئەوەی کۆتایی ئەوە تەنها نوسەرە بەهەرەمەندەکان پێی دەگەن , بۆیە ئێمە دەبێ هەولبدەین کە دەربرینەکانمان و دارشتنەکانمان لە جۆری سێیەم بێت , ئەم جۆرە زمانەش بە ئاسانی بەدەست نایەت بەڵکو بە راهێنان و خوێندنەوەی بەردەوام دەبێت.ئەمەش کۆمەلێك

جۆری ئەدەبیە کە لەمە بەرجەستە دەبێت وەك: هۆنراوە, چیرۆك, پەخشانی سۆزداری کاریگەر, وتاری, شانۆ....

ئەمانەش دو کۆلەگەی هەیە (سۆز و نوێگەری) کەلەناو ئەم جۆرە نوسین و دەربرینەدا هەیە .

مرۆڤگەلێك کێشەی نوسینیان هەیە,ناتوانن ئەو بیرەی لەناو ناخیان هەیە بە شێوەیەکی رێك دایرێژن. لێرەوە چەند خالێك دەخەمە روو سەرەتا بۆخۆم پاشان بۆ ئێوەی بەرێز.

پێییان دەڵێم :

1-دەست پێ بکە

پاش چەندین ساڵ لە هەول و خوێندن و تاقیکردنەوە و نوسینی کەم,دەست بە نوسین بکە و ناوی (الله)ی لێ بهێنە ,گرنگی بەوە مەدە کە خەلك چی دەلێن :دەربارەی نوسینەکەت بەلکو گرنگی بە نوسینەکانت بدە و بە

جوانترین شێوه بینا نخەروو قسەیەك هەیە دەلیَ( برِینی چەندین کیلۆ مەتر به هەنگاوی یەکەم دەست پێکرایە )

2-سارد مەبەوە

مرۆڤ زوو سارد دەبێتەوە لەکارەکانییدا بەڵام له ئاما نجه سەرەکەیەکان نابیَ سارد بیینەوە و هەردەم کۆشش بکەین بۆ باشترین و تا گەیشتن به چلە پۆپەی ئاواتەکان .

گەیاندنی هەست و سۆز و بیرو بۆچون له ریَی نوسینەوە ئاسان نیە وەك زۆرێك وا گومان دەکەن بەڵکو , پێویستی به خوێندن و خوێندنەوە و فێربون و خود پێگەیاندن و راهێنان و شێوازی جۆراو جۆرو هەیە .

دەربرین بەهەردو جۆرەکەی ( زارەکی و نوسینەکی ) پێویستیەکی رۆژانەیە له هەمو هەلسوکەوتی رۆژانەماندا بونی هەیە , بۆیە لەسەر هەمومان پێویستە فێری یاساکانی دەربرین .

## رازی نوسین

*نوسینی باش ئەوەیە کە کاریگەری لەسەر خوێنەر جێبهێڵێ .

*خوێندنەوە و نوسین دوانەن لێك جیاناکرێنەوە , هەرچەند زیاتر بخوێنیتەوە رێکتر و باشتر دەنوسی .

* نوسەر بیرتیژترە لەکەسانی تر, لەبەر زۆری تێبینی و بیرکردنەوەکانی

*زۆر گرنگە نوسەر بزانێ بۆ کی دەنوسێت , وە کێ نوسینەکانی دەخوێنێتەوە .

*نوسینی چاك پێویستی بە بیرکردنەوەی چاك هەیە .

## کۆمەڵێك سەرچاوەم بەکار هێناوە گرنگترینیان

1- قورئانی پیرۆز

2- فەرمودەکانی سەروەرمان

3- پەرتوکی ( صبح الاعشی ) قلقشندی.

4- مهارات الكتابه

5- فن الكتابه

6- وە زۆرێکی تریش .......

## كۆتایی

ئەم بەرهەمە بۆخومە  پاشان بۆ ئەوانەیە كە دیانەوی دەربڕینیان باشتر كەن

.

سوپاسی د.علی عمر  و م حمزە شوانی و م رێباز شێخە و م یوسف زیاد  دەكەم

كە هاوكار بون

بۆ هەر رەخنەو پێشنیارێك بیَ زەحمەت   ئاگادارم كەنەوە .

والسلام علیكم ورحمة الله وبركاته